# أُصُولُ السُّنَّةِ



لإمام شيخ الإسلام أبي عبدالله
أحمد بن حنبل الشيباني
(١٦٤ - ٢٤١ هـ)

**رواية عبدوس العطار**



وەرگێڕانی :

**ابي عبداللّٰه**

١٤٤٤ هـ

## ١ - ئیمام أحمد رحمه الله دەڵێت : بنچینەی سوننەت لای ئێمە، دەست گرتنە بەوەی هاوەڵانی رسول الله ﷺ لەسەری بوون، وە ئیقتیدایان پێوە بکەین - واتە هاوەڵانی رسول الله ﷺ بکەینە پێشەنگی خۆمان - .

---

هاوەڵان ئەو کەسانەنن کە سێ خاڵیان تێدایە، یەکەمیان ئەوانەنن کە پێغەمبەر ﷺ یان بینیووە، وە ئیمانیان پێی هێناوە، وە بە موسڵمانیەتی مردبن، چونکە زۆر کەس هەبووە پێغەمبەر ﷺ ی بینیووە و کافریش بووە، وە زۆرکەسیش کەوا پێغەمبەر ی ﷺ بینیوە و مووسڵمان بووە و پاشان مورتەد بووەتەوە ئەوە پێی ناوترێت هاوەڵ

هاوەڵان رضي الله عنهم نزیکترین کەس بوون لە رسول الله ﷺ، ئەوکاتەی کە قورئان دادەبەزی ئەوان ئامادە بوون، ئەیانزانی کام ئایەتە و کام سوورەتە بۆ چ شتێک و لە کام شوێندا دابەزیوە و مەبەست پێی کێیە، هەربۆیە ئێمەش پێویستە لە تێگەیشتنمان بۆ قورئان و فەرموودە بگەڕێینەوە بزانین ئەوان چۆن لێی تێگەیشتوون ئێمەش وا تێبگەین .

لە قورئان و فەرموودەدا بەڵگەی نەقڵی زۆر هەیە کە هانمان ئەدەن ئیقتیدا بکەین بە هاوەڵان و ئەوانەی بە ڕاستی شوێنیان کەوتوون لە تابیعین و ئەتباعی تابیعین، لێرەدا دەمەوێت باسی تەنها یەک بەڵگەی ئەقلی بکەم، ئایا هاوەڵان رضي الله عنهم قورئانیان خوێندووەتەوە؟ بێگومان هەموو کەسێک دەڵێت بەڵێ خوێندوویانەتەوە، زۆر باشە، ئایا کاتێک خوێندوویانەتەوە لێی تێگەیشتوون؟ بێگومان هیچ کەسێک ناڵێت تێنەگەیشتوون مەگەر زۆر کافر بێت، کەوایە وەڵامەکە ئەوەیە کە تێگەیشتوون، مادەم وایە با ئێمەش شوێن تێگەیشتنی هاوەڵان بکەوین و بڕۆینەسەر ڕێگەی سەلامەتی و سەرفرازی .

لەلای ئەهلی سوننە و جەماعە دین تەنها بریتی نییە لە قورئان و فەرموودە، بەڵکو بریتیە لە قورئان و فەرموودە و ئاثاری سەلەف، ئاثاری سەلەف ڕوونکەرەوەی قورئان و فەرموودەن .

نابێت وەکو ظاهیریە گومڕاکان تەنها بڵێین قورئان و فەرموودە و بەس، چونکە ئەگەر تۆ شوێن تێگەیشتنی سەلەف نەکەویت بۆ قورئان و سوننەت کەوایە دەبێت خۆت لە قورئان و سوننەت تێبگەیت، ئەی باشە تۆ باشتر لە قورئان و سوننەت تێئەگەیت یان سەلەف؟ بێگومان سەلەف، کەواتە رحمک الله با مەنهەجی تۆ قورئان و سوونەت بە تێگەیشتنی سەلەف بێت .

## ٢ - وە وازبهێنرێت لە بیدعە لە گومڕایی، چونکە هەموو بیدعەیەك گومڕاییە.

: هەموو بیدعە و داهێنراوێک لە دیندا گومڕایی و سەرلێشێواویە، بەڵکو دەبێت هەمووومان دەست بەووە بگرین کە سەلەف لەسەری بوون و لەوە نە زیاتر بڵێین نە کەمتر، نابێت وەکو سۆفیە گومڕاکانی ئێستا بیت کە شوێن هەموو ئەو بیدعەیانە دەکەون کە شێخە گومڕاکانیان بۆیان دادەهێنن لە دیندا، بەڵکو هەر عیبادەتێکت کرد لە دنیدا دەبێت بەڵگەت پێبێت کە سەلەف هەمان عیبادەتی تۆ بە هەمان شێواز و جۆر لە هەمان حاڵ و شوێندا ئەنجامیان داوە .

٣ - وه واز هێنانه له مشتومڕ كردن و موناقەشەكردن، وازهێنان له جیدال كردن و بەربەرەكانێ كردن له دیندا .

: ئەوانەی كه زۆر موناقەشه دەكەن له دیندا دەبینیت وای لێدێت ئیتر حەق قبووڵ ناكات، بەڵكو هەمیشه بەشوێن ئەووەوەیه سەربكەوێت بەسەر بەرامبەرەكەیدا، ئەم جۆره كەسانه هەرگیز سەرفراز نابن چونكه دین بۆ ئەوە هاتووە تەسلیمی ببیت و شوێنی بكەویت نەوەک بیكەیت به بابەتی موناقەشەكردن، بەڵكو عەقیدە و كتێبەكانی سەلەف بخوێنەرەوە و وەكو خۆی وەربگرە .

٤ - وازهێنان له دانیشتن لەگەڵ هاوەڵانی هەوا و ئارەزوو ئەوانەی كه به پێی بیرو بۆچوونی خۆیان - بەپێی ئارەزووی خۆیان - دین وەردەگرن .

: هەرگیز كەسێک سەرفراز نابێت كه دین بەگوێرەی هەوا و ئارەزوو و ڕەئی خۆی وەربگرێت، وه ئایەت و فەرموودەكان بەشێوەیەک تەفسیر بكات كه لەگەڵ هەوا و ئارەزووی خۆیدا بگونجێت، بەڵكو دەبێت دین وەربگریت و شوێنی بكەویت، نەوەی دین بكەیت به شوێنكەوتەی هەوا و ئارەزووەكانت، پاشان نابێت لەگەڵ ئەوجۆره كەسانەدا دابنیشیت كه بەو شێوەیەن ، چونكه لەوانەیه تۆش بەخۆیانەوە گومڕا بكەن .

## ٥ - سوننەت لەلای ئێمە، ئاثاری رسول اللە یە ﷺ .

: ئاثاری رسول اللە ﷺ واتە ئەوە کە لێی بەجێماوە، واتە سوننەت و فەرموودەکان .

## ٦ - وە سوننەت قورئان ڕوون دەکاتەوە، وە سوننەت بەڵگەیە بۆ قورئان.

: زۆر بابەت هەن لە قورئاندا تەنها بە گشتی باسکراون یان تەنها بە وشەیەک هاتون بەڵام لە سوننەت زۆر بە جوانی ڕوونکراوەتەوە و شیکراوەتەوە، بۆ نمونە لە قورئاندا باسی نوێژ کراوە بەڵام باسی شێوازی نوێژ و چەندێتی ڕکاتەکانی و وردەکاریەکانی نەکراوە، لەبەر ئەوەی رسول اللە ﷺ ڕوونی بکاتەوە بۆ خەڵکی و ئەوانیش شوێنی بکەون، نابێت وەکو ئەو کەسانەی کە بە خۆیان دەڵێن قورئانیەکان (کە حاشا دژی قورئانن و کافرن) فەرموودە قبووڵ نەکەیت و بڵێیت تەنها لەسەر قورئان دەڕۆم، بەڵکو اللە تعالى بە رسول اللە دەفەرمووێت کە قورئانمان ناردووەتە خوارەوە بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیتەوە | وَأَنْزَلْنَا إِلَيْكَ الذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ | .

## ٧ - وە لە سونەنتدا قیاس نیە، وە نمونەی خراپ بۆ سوننەت ناهێنرێتەوە، دەبێت سوننەت لە زانایانی سەلەف وەربگیرێت، نابێت بەپێی عەقڵ و هەوا و

ئارەزووی خۆت درکی پێ بکەیت، سوننەت ئەوەیە کە شوێن کەوتەبیت و وازبێنیت لە هەوا و ئارەزوو .

: (لە سونەنتدا قیاس نیە) لێرەدا ئیمام مەبەستی قیاسی باتڵ و پووچە، چونکە قیاس هەیە لەسەر بناغەی قورئان و سوننەت، وە قیاسیش هەیە بەگوێرەی هەوا و ئارەزوو و ڕەئ و بۆچوون، ئەهلی سوننە و جەماعە هەمیشە شوێن قورئان و سوننەت دەکەون، ئەگەر بابەتێکی تازە هاتە پێشەوە کە لە قورئان و سوننەتدا بە ڕاشکاوی شتێکی لەبارەوە نەهاتبێت ئینجا دێن قیاس لەسەر ئایەت و فەرموودە و وتەی هاوەڵان دەکەن، واتە لەلای ئەهلی حەدیث یەکەمجار قورئان و سوننەت و ئاثار، ئەگەر لەوانەدا باسی بابەتە نوێیەکە نەکرابوو ئینجا قیاس دەکەن لەسەر قورئان و سوننەت و ئاثار، بەڵام ئەهلی ڕەئی کە ئەبو حەنیفە سەرگەورە و ئیمامیانە واز لە قورئان و سوننەت دەهێنن بۆ قیاس و ڕەئی خۆیان، ئەوانە بێ شک و گومان گومڕان هەر بۆیە خۆت لە ئەوان و شوێنەکەوتووەکانیشیان بپارێزە .

وە لەو سوننەتانەی کە هەر کەسێک وازی لە یەک دانەی هێنا قبووڵی نەکرد و ئیمانی پێی نەبوو لە ئەهلەکەی نییە بریتیە لە :

٨ - ئیمان هێنان بە قەدەر بە خێر و شەڕیەوە، وە بەڕاستزانینی ئەو فەرموودەیانەی کە لەبارەیەوە هاتوون، ئیمانیان پێ بهێنیت، ناوترێت : بۆچی؟ یان چۆن؟ ئەو شتە ڕوویدا، بەڵکو تەنها بەڕاستی دەزانیت و باوەڕیی پێ دەهێنیت، وە هەر کەسێک مانای فەرموودەکەی نەزانی و درکی پێ نەکرد ئەوە

بەسیەتی بۆی - واتە ئەگەر نەشزانێت فەرموودەکە واتای چییە ئەوە گەیشتنی فەرموودەکە پێی بەسە و دەبێت باوەڕی پێ بهێنێت و بەوە حوکمی لەسەر دەدرێت، والله أعلم - ، بەڵکو لەسەر ئەو پێویستە کە ئیمانی پێ بهێنێت و تەسلیم بێت، وەکو فەرموودەی الصادق المصدوق، وە ئەو حەدیث انەی دەربارەی قەدەر هاتووە هاوشێوەی ئەو، بۆ نمونە حەدیث ـەکانی : بینینی الله تعالى هەموویان، ئەگەر چی تازە و نامۆ بوو بۆ ئەو کەسەی گوێی لێ دەبێت، ئەوا لەسەریەتی تەنها ئیمانی پێ بهێنێت، وە یەك حەرف یش ڕەتناکرێتەوە لە حەدیث ی پێغەمبەر ﷺ کەوا هاتوون لە پیاوانی خاوەن متمانەوە .

---

: هەموو شتێک و هەموو کارێک قەدەری الله عز وجل ە، ئەگەر شتەکە باش بێت یان خراپ، ئەگەر خۆش بێت یان ناخۆش، بۆ نموونە نوێژکردن قەدەری الله عز وجل ە، وە دزی کردن قەدەری الله عز وجل ە، وە لە هەمان کاتدا الله تعالى عەقڵی پێداویت و پەیامبەری بۆ ناردوویت بۆ ئەوەی شتە باشەکانت پێ پیشان بدات و بیانکەیت، وە لە شتە خراپەکان ئاگادارت بکاتەوە و لێیان بەدوور بیت .

٩ - وە هەروەها نابێت جیدال و مشتومڕ و مونازەرە لەگەل هیچ کەسێک بکەیت، وە نابێت فێری جیدال و موناقەشە بیت، لەبەر ئەوەی قسەکردن لە بارەی قەدەر و بینی الله تعالى و قورئان وە جگە لەوانەش لە سوننەتدا ئەوانە

مەکرووهن، وە نەهی لێکراوە، وە ئەگەر خاوەنەکەی هاتوو بە قسەکانی سوننەت بپێکێت ئەوە نابێت بە ئەهلی سوننەت، هەتا واز لە موناقەشە دەهێنیت و ئیمان بە ئاثارەکان دەهێنێت .

١٠ - قورئان کەلامی الله یە وە مەحلوق نیە، وە نابێت لاواز بیت لەوەی بڵێیت مخلوق نییە، لەبەر ئەوەی سیفەتی کەلام ی الله تعالى لە الله جیانیە، وە هیچ شتێکی ئەویش مخلوق نییە .

---

: قورئان کەلامی الله تعالى یە، الله تعالى سیفەتی کەلامی هەیە، وە سیفەتەکانی الله مخلوق نین، چونکە الله تعالى خۆی مخلوق نییە، کەوایە ناو و سیفاتەکانیشی مخلوق نین، وەکچۆن تۆ مخلوقیت، هەموو شتێکی تۆ مخلوق ە، موعتەزیلی و جەهمی و کوللابی و ئەشعەری و ماتوریدیەکان باوەڕیان وایە کە قورئان مخلوق ە، هەربۆیە کافر و زەندیقن .

١١ - وە ئاگاداربە لەوەی مونازەرە بکەیت لەگەڵ ئەو کەسەی شت دادەهێنێت دەربارەی قورئان یان قسە بکات بە لفظ، یانود بوەستێت بەوەی بڵێت نازانم کە قورئان مەخلوقە یان مەخلوق نیە، وە تەنها بڵێت کەلامی الله یە ئەوە خاوەنی بیدعە یە، هەر وەك ئەوە وایە وتبێتی قورئان مەخلوقە، بەڵکو قورئان کەلامی الله یەو مەخلوق نیە.

---

: جەهمیەکان سێ جۆرن، مخلوقیەکان، ئەوانەی کە دەڵێن قورئان مخلوقە، واقیفیەکان، ئەوانەی کە دەڵێن ناڵێین قورئان غیر مخلوق ە، وە لەفظیەکان کە دەڵێن لەفظی ئێمە بە قورئان یان قورئان بە لەفظی ئێمە مخلوقە، ئەم سێ کۆمەڵەیە بە قسەکانیان مەبەستیان ئەوەیە بڵێن قورئان مخلوقە، وتەی جۆری یەکەم واتە مخلوقیەکان دیارە کە دەڵێن قورئان مخلوقە، جۆری دووەم کە دەکاتە واقیفەکان هەر هەمان عەقیدەی مخلوقیەکانیان هەیە بەڵام فێڵ دەکەن دەڵێن ئێمە ناڵێین غیر مخلوق ە، لەکاتێکدا هەموو موسوڵمانێک دەزانێت کە کەلامی الله غیر مخلوقە، وە جۆری سێیەمیان کە دەڵێن لەفظمان بە قورئان مخلوق ە هەمان مەبەستی جۆری یەکەمیان هەیە بەڵام بە شێوازێکی تر دەریدەبڕن، کوللابی و ئەشعەری و ماتوریدیەکان لەم جۆرەی جەهمیەکانن، ئەهلی سوننە نە دەڵێن لفظمان بە قورئان مخلوق ە، نە دەڵێن غیر مخلوق ە، بەڵکو قسەی تێدا ناکەن چونکە بیدعەی جەهمیەکانە .

## ١٢ - ئیمان هێنان بە بینینی الله تعالی لە ڕۆژی دوای، هەروەك هاتووە وە گێڕدراوەتەوە لە پێغەمبەر ﷺ لە حەدیث ە صحیح ەکان .

: ئەهلی سوننە و جەماعە باوەڕیان وایە کە لە ڕۆژی دوایدا موسوڵمانان الله عز وجل دەبینن لەبەر ئەو هەموو بەڵگەیەی دەربارەی هاتووە لە قورئان و فەرموودە، بەڵام جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدیە زەندیقەکان باوەڕیان وا نییە کە الله تعالی ببینرێت بەو شێوەیەی کە لە قورئان و فەرموودەدا هاتووە، واتە نەفی بینینی الله تعالی دەکەن .

١٣ - وە پێغەمبەر ﷺ پەروەردگاری خۆیی بینیوە، ئەمە بە صەحیحی لەلایەن رسول الله وە ﷺ باسکراوە .

قتادة گێڕاویەتیەوە لە عِکرمة لە إبن عباس.

وە الحکم بن أبان گێڕاویەتیەوە لە عِکرمةَ لە ابن عبَّاس .

وە علي بن زید گێڕاویەتیەوە لە یوسف بن مهران لە ابن عباس .

وە حەدیث لەلای ئێمە لەسەر ڕووکەش - لەسەر زاهیری - ، وەردەگیرێت، وەك لە رسول الله وە هاتووە ﷺ وە قسەکردن تێدا بیدعەیە، بەڵکو ئێمە باوەڕی پێ دەهێنین وەك چۆن هاتووە لەسەر زاهیری حەدیث ەکە، وەهیچ مووناقەشەیەکی لەسەرناکەین.

---

(حەدیث لەلای ئێمە لەسەر ڕووکەش وەردەگیرێت) ئەم وتەیەی ئیمام أحمد عەقیدەی : رسول الله ﷺ و هاوەڵان و تابیعین و تەواوی سەلەفە رحمهم الله، ئایەت و فەرموودە لەسەر ڕووکەش وەردەگیرێت هەتا ئەوکاتەی بەڵگەیەی سەحیح دێت کە ئایەت و فەرموودەکە لەسەر ڕووکەش نییە بەڵکو مانایەکی تری هەیە، وە تەواوی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات لەسەر ڕووکەش وەردەگیرێت، واتە کاتێک الله تعالى دەفەرمووێت لەسەر عەرش بەرزبووەتەوە ئەوە هەر بەڕاستی لەسەر عەرش بەرز بووەتەوە، کاتێک دەفەرمووێت دەستی هەیە ئەوە بەڕاستی دەستی هەیە، کاتێک دەفەرمووێت دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا ئەوە هەر بە ڕاستی دادەبەزێتە ئاسمانی دونیا، وە لە هەمان کاتدا دابەزینی الله تعالى لە دابەزینی دروستکراوەکانی ناچێت،

دەستەکانی الله تعالی لە دەستی دروستکراوەکانی ناچێت، بەڵام جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدیە زەندیقە کافرەکان ڕووکەشی ئایەت و فەرموودەکانی سیفات بە کوفر و تەشبیهـ دەزانن، هەربۆیە دێن تەحریفی واتای ئایەت و فەرموودەکان دەکەن، بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەو عەقیدە کەلامیە کوفریەدا بگونجێت کە هەیانە، چونکە بناغەی عەقیدەی جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدیە زەندیقەکان لەسەر قورئان و فەرموودە نییە، بەڵکو لەسەر بەناو عیلمی کەلامی کوفریە .

١٤ - وە ئیمان هێنان بە تەرازوو لە ڕۆژی قیامەتدا هەروەك هاتووە، تەرازوو پێوانەی بەندە دەکات هێندە باڵە مێشوولەیەک قورس نییە، - مەبەستی ئەوەیە بەندەی واهەیە پێوانە دەکرێت ناگاتە هێندەی باڵە مێشولەیەك - ، پێوانەی کردەوەکانی بەندەکان دەکرێت هەروەك هاتووە لە ئاثار، دەبێت باوەڕی پێ بهێنرێت وە بەڕاستی بزانیت، وە پشت لەوە بکەیت کە ئەمە ڕەت دەکاتەوە، وە وازبهێنیت لە موجادەلەکردن و موناقشەکردن لەگەڵی .

١٥ - الله تعالی قسە لەگەڵ بەندەکانی دەکات لە ڕۆژی قیامەت، هیچ وەرگێڕێک لە نێوان ئەو بەندەکانیدا نیە، وە دەبێت ئیمانی پێ بهێنرێت و بەڕاستی دانێت .

---

سەلەف رحمهم الله بە پشتبەستن بە بەڵگەی قورئان فەرموودە باوەڕیان وایە کە الله تعالی لە ڕۆژی قیامەتدا قسە لەگەڵ بەندەکانیدا دەکات، وە قسەی لەگەڵ پێغەمبەر موسادا

ﷺ كردووه له كێوی طور، بەڵام جەهمی و موعتەزیلی و ئەشعەری و ماتوریدیه كافرەكان به پشتبەستن به گومانی بەناو عیلمی كەلامی كوفری ڕەتی ئەوە دەكەنەوە الله به شێوازێكی حەقیقی قسە بكات .

١٦ - ئیمان هێنان به حەوض، رسول الله ﷺ حەوض ێكی هەیە كە لە ڕۆژی قیامەت ئوممەتەكەی لەسەری كۆدەبنەوە، پانتایەكەی وەكو درێژیەكەیەتی، كە مەسافەكەی بەقەد مانگێكە، ژمارەی كوپەكانی كە ئاوەكەی پێ دەخورێتەوە بەقەد ژمارەی ئەستێرەكانی ئاسمانە، لەسەر ئەو هەواڵ و ئاثارانەی كە به صحیحی لەسەری هاتوون .

١٧ - ئیمان بوون به سزای گۆڕ، ئەو ئوممەتە تاقیدەكرێنەوە لە گۆڕەكانیان وە پرسیاریان لێدەكرێت، دەربارەی ئیمان و ئیسلام؟ وە كێ پەروەردگاریەتی؟ وەكێ پێغەمبەریەتی؟

وە دوو فریشتە دێنە لایان كە - مُنكر و نَكیر دوو فریشتەن بەندە تاقیدەكەنەوە لەناو گۆڕە - ، چۆن الله تعالی بیەوێ، وە چۆن ویستی لێبێت عز وجل ئاوا تاقیان دەكاتەوە، وە دەبێت باوەڕت پێی هەبێت وە بەڕاستی بزانیت.

١٨ - ئیمان به شەفاعەتی رسول الله ﷺ ، ئەم شەفاعەتە بۆ كۆمەڵانێك دەكات كە دەخرێنە ناو دۆزەخ و دەبنە خەڵوزوو و دەسوتێنرێن، پاشان

دەهێنرێنە دەرەوە بەهۆی شەفاعەتی رسول الله بۆیان ﷺ، ئەمریان پێ دەكرێت كە بهێنرێنە دەرەوە لەسەر ڕووبارێك لەلای دەرگای بەهەشت هەر وەكو لە حەدیث هاتووە، وە هەر چۆنێك الله جل شأنه بیەوێت بەویستی لێبێت وادەبێت، دەبێت ئیمانمان پێی هەبێت و بەڕاستی بزانین .

---

: بەشێک لە خەواریج و موعتەزیلەکان باوەڕیان بەو جۆرە شەفاعەتە نییە کە ئیمام أحمد لێرەدا باسی کردووە .

**١٩** - ئیمان بەوەی كە مەسیحی دەجال دەردەچێت لەنێوان هەردوو چاوی نوسراوە كافر، ئیمان بهێنیت بەو حەدیث انەی كە دەربارەی دەجال هاتوون .

---

: بەشێکی زۆر لەوانەی کە شوێن حیزبە بەناو ئیسلامیەکان کەوتوون و کاریگەرن بە عەلمانیەکان باوەڕیان بەوە نییە کە دەجال دەربچێت بەو شێوەیەی لەم فەرموودەکاندا هاتووە، بەڵکو ڕەتی ئەکەنەوە و واتای فەرموودەکان دەگۆڕن .

**٢٠** - عیسى بن مریم ﷺ دادەبەزێت و لەبەردەرگای لُد دەیكوژێت .

: پێغەمبەر عیسی ﷺ نەمردووە و الله تعالی بەرزی کردووەتەوە بۆ ئاسمان، پێش هاتنی قیامەت لە دیمەشق دادەبەزێت لەلای منارەی شەرقی، ئەوجا لەوێ دادەبەزێت و دوای دەجال دەکەوێت لە بەردەرگای لُد دەیکوژێت .

لُد جێگایەکە لەلای قودس ەوە، ئەو شووێنەیە کە مەسیح دەجال دەیگاتێ و پێغەمبەر عیسی ﷺ لەوێ دەیکوژێ .

**٢١ - ئیمان وتە و کردەوەیە، زیاد و کەم دەکات هەروەك چۆن هاتووە**

لە حەدیث ی رسول الله ﷺ دەفەرمووێت : (تەواوترین ی ئیمانی ئیماندارانی ئەوانەن کە جوانترین ڕەوشتیان هەیە).

بەڵکو ئیمان زیاد و کەم دەکات شتێك زیادبکات کەمیش دەکات .

وە هەرکەسێك واز لە نوێژ بهێنێت ئەوە کافر بووە .

---

: سەلەف رحمهم الله کار و کردەوەی بە شەرتی صحة واتە دروستێتی ئیمان دەزانن، بەڵام هەموو مورجیئەکان، وە ئەو مورجیئەیانەی سەردەم کە لە ڕووکەشدا هەمان قسەی سەلەف دەکەن بەڵام لەدوای ڕووکردنەوەی قسەکانیان هەمان عەقیدەی مورجیئە کۆنەکانیان هەیە دەڵێن کار و کردەوە مەرجی شەرتی کمال ە نەوەک شەرتی صحة .

**٢٢** - وه هيچ شتێك نيه له كردەوەكان وازی لێبێنيت كوفربێت ئيللا نوێژ نەبێت، هەركەس واز له نوێژ بێنێت ئەوه كافره، الله تعالى كوشتنی حەڵاڵ كردووه .

---

: تاوانەكان دوو جۆرن، جۆرێكيان بەشێكيان مرۆڤ ئەگەر تەنها ئەنجامی بدات ئەوه تاوانباره، بەڵام ئەگەر تاوانەكە بە حەڵاڵ بزانێت ئەوه كافره، بۆ نمونە كەسێک پارە دەدزێت، ئەمە تاوانباره، بەڵام ئەگەر پارە دزين بە حەڵاڵ بزانێت ئەوە پێی كافر دەبێت، جۆرێكی تريان هەيە خودی تاوانەكە كوفره، ئەگەر بە حەلاڵی بزانێت يان نا، بۆ نمونە نوێژ، هەر كەسێک نوێژ تەرک بكات ئەگەر چی خۆشی بە تاوانبار بزانێت ئەوە هەر كافره، وه بزانە لە تاواندا مەرجی بەحەلاڵ دانان هەيە بۆ كافربوونی تاوانبارەكە، بەڵام ئەگەر كوفری ئەنجامدا ئەوە بە حەڵاڵی بزانێت يان نا هەر كافره .

**٢٣** - باشترينی ئەم ئوممەته لە دوای پێغەمبەر ﷺ، أبو بكر الصديق، پاشان عمر بن الخطاب، پاشان عثمان بن عفان، وه ئەو سيانە پێشيان دەخەين، چونكه صحاب ەی رسول الله ﷺ پێشيان خستون و هيچ ئيختلافێكيان لەسەری نەبووه .

**٢٤** - له پاش ئەو سیانە پێنج هاوەڵانی شورا، علي بن أبي طالب، والزبير، طلحة، عبد الرحمن بن عوف، وسعد بن أبي وقاص، هەر پێنج یان چاکسازیان کردووە لە خیلافەتدا، وە هەمووشیان ئیمامن .

---

: بۆ دەستخستنی زانیاری زیاتر لەبارەی بابەتەکەوە ئەم دوو پۆستە بخوێننەوە :

https://t.me/Huud1/621

https://t.me/Huud1/622

**٢٥** - وە بۆ ئەمەش دەگەڕێینەوە بۆ حەدیث ی ابن عمر فەرمووی : ئێمە دەمان ژماردن وە پێغەمبەر ﷺ زیندوبوو لە ژیاندا بوو، وە هاوەڵان کۆك بوون لەسەر ئەوەی کە سەرەتا ابو بکر پاشان عمر پاشان عثمان پاشان بێدەنگ دەبین .

**٢٦** - پاش هاوەڵانی شورا ئەهلی بەدر دێن لە مهاجرین، پاشان ئەهلی بەدر لە انصار لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، بەپێی هیجرەتی کردووە پێشتر - واتە ئەوەیی پێشتر هیجرەتی کردبێت - ، ئەوە لەپێشترە.

**٢٧** - پاشان باشترین خەڵك لەدوای هاوەڵانی رسول الله ﷺ، سەدەی دووای ئەوانن کە هاتوون، وە هەموو ئەوانەی هاوەڵایەتی رسول الله یان کردووه ﷺ ساڵ یێك، یان مانگ یێك، یان رۆژێك، یان سەعات یێك، ئەوەی بینیوویەتی هاوەڵی پێغەمبەرە ﷺ، بەپێی ئەوەی کە هاوەڵێتی لەگەڵ پێغەمبەر کردووه ﷺ بە قەدەر هاوەڵێتیەکەی ئەفزەڵیەتیەکەی بۆ دادەنرێت، وە ئەوەی کە لە پێشوو لەگەڵ ی بووە و گوێی لێ بووە و وە یەك جاریش بینیبێتی، ئەوەی کەمترین هاوەڵێتی لەگەڵ پێغەمبەر ﷺ کردبێت ئەوە ئەفزەڵترە لەو قەرنەیی کە هیچ پێغەمبەریان نەبینیووە ﷺ ئەگەر چی بە الله بگاتەوە بە هەموو کردەوە باشەکانی، چونکە ئەوانە هاوەڵێتی پێغەمبەر یان کردووە ﷺ، وە بینیوویانە وە لە پێغەمبەر یان بیستووە ﷺ ئەوەی بینیوویەتی بەچاوەکانی خۆیی و باوەڕیی پێهێناوە ئەگەرچی سەعاتێك بێت، ئەوە ئەفزەڵترە چاکترە لەوەی کە لەسەردەمی تابعینەکان بووە ئەگەرچی هەموو کردەوەیەکی خێریشی کردبێت.

**٢٨** - گوێڕایەڵی پێشەوایانی ئیمانداران جا چاکەکاربێت یان خراپەکار، وە ئەوەی کە پێشەوایەتی خیلافەت دەکات، وە خەڵك لەسەری کۆبوونەتەوە و وەڕازیبن پێی، وە هەرکەسێك سەرکەوت بە شمشێرەکەی تاوەکو دەبێتە خەلیفە ناوی لێدەنرێت ئەمیری ئیمانداران.

**٢٩** - جیهاد و قیتالی كافران دەكرێت تا قیامەت لەگەڵ ئیمام جا چاكەكاربێت یان خراپەكار. وە هەروەها جەنگ بە بەردەوامی لەگەڵ ئەمیردا دەكرێت تا ڕۆژی قیامەت جا چاكەكاربێت یان خراپەكار وازی لێ ناهێنرێت، نابێت واز لەئەمیر بێنیت لەبەر ئەوەی خراپەكارە.

**٣٠** - دابەشكردنی الفيء - الفيء : ئەو دەستكەوتەی كە لە جەنگ دەستی مووسڵمانان دەكەوێت بەبێ جەنگ كردن - ، جێ بەجێ كردنی سنورەكان هەموو پێشەوای موسڵمانان دەیكات، بۆ هیچ كەسێك نیە تانەوتەشەر لەسەر بڕیارەكانی بدات وە نابێت نارەزایی دەربڕێت .

---

لەم چەند ئەثەرەدا كە ئیمام باسی گوێڕایەڵی خەلیفە و دەسەڵتدار و بردنەوەی زەكات بۆلایان و چەندین شتی تر مەبەست پێی دەسەلاتدارێكی موسڵمانە، نەوەک عەلمانیە كافرەكانی ئەم سەردەمە .

**٣١** - بردنەوەی صەدەقە - زەكات - بۆلای پێشەوایانی موسڵمانان درووستە و جێ بەجێ كراوە، هەركەسێك صەدەقەكانی بباتە لای پێشەوای مووسڵمانان ئەوا پاداشتی لەسەر وەردەگرێت جا ئەگەر پێشەواكە چاكەكاربێت یان خراپەكار .

**٣٢** - وه نوێژی جمعه له پشتی پێشەوایان و ئەوانەشی کە کاربەدەستن ڕێ پێدراوە و ئەنجام دراوە، ڕێگە پێدراوە و درووستە دوو ڕکعاتی تەواو لەگەڵیان دەکەیت، هەر کەس ئەو دوو ڕکعاتە دووبارە بکاتەوە ئەوە موبتەدیعە و وازی هێناوە لە ئاثار و پێچەوانەی سوننەت بووە، هیچ فەزڵێکی جمعەی بۆ نیە ئەگەر هاتوو وای نەبینی کە نوێژ بکات لە پشتت پێشەوایان ئەگەر چی چاکەکاربێت یان خراپەکار، سوننەت ئەوەیە کە نوێژ لە پشتەوەیان دەکرێت دوو ڕکعاتیان لەگەڵ دەکەیت، بەوەی کە تەواوە ئەو دوو ڕکعاتە، وەهیچ ناڕەحەتی و هیچ گومانێك لەسەر سینەت درووست نەبێت .

: هەموو کاربەدەستێک یاخود ئەو کەسانەی کە کاربەدەستان دایاننناون جائیزە لە پشتیانەوە نوێژ بکرێت بە مەرجێک موسوڵمان بن، ئەگەر موسوڵمان نەبن ئەوە دوو ڕکعات نوێژی هەینی لە پشتیانەوە ئەکرێت، بەڵام کەسەکە پاش ئەوە چوار ڕکعات نوێژی نیوەڕۆ دەکاتەوە چونکە نوێژی لەپشت کافرێکەوە کردووە، خودی ئیمام ئەحمەد لەکاتی فیتنەی خەڵقی قورئاندا نوێژی لە پشت ئیمامە جەهمیەکان دەکرد بەڵام کە دەگەڕایەوە بۆ ماڵ چوار ڕکعات نوێژی دەگێڕایەوە چونکە نوێژەکەی پێشووی بەتاڵ بووە .

**٣٣** - ئەوەی دەربچێت لەسەر پێشەوایەك لە پێشەواکانی موسڵمانان لە کاتێکدا خەڵکی هەموو لەسەری کۆبوونەتەوە و دانیان بەودناوە بۆ

خیلافەت بەهەر ڕوویەك لە ڕووەكـان جا بە ڕازی بوون بێت یاخود بە زاڵبوون، ئەو گۆچانەی نێووان موسڵمانـكانی شـەق كـردووە - مەبەستی ئەوەیە لێرە ڕیزی مووسڵمانەكانی تێكداوە - ، وە پێچەوانەی ئاثاری رسول الله ﷺ ی كـردووە، وە ئەگەر بمرێت بەهۆی ئەوەی كە دەرچووە لە پێشەوایەك لە پێشەوایانی مووسڵمانان ئەوا بە مردنێكی جاهیلانە مردووە .

**٣٤** - بۆ هیچ كەسێك درووست نیە كوشتار لەگەڵ پێشەوایانی مووسڵماناندا بكات، وە نابێت لێی دەربچێت بكات، بۆ هیچ كەسێك نیە لە خەڵكی لێی دەربچێت، هەركەسێك وا بكات ئەوا لەسەر غەیری ڕێگای سوننەتە .

---

: جائیز نییە خروج لەسەر ئیمامێکی موسوڵمان بکرێت ئیللا مەگەر کوفری لێ ببینرێت، وەکچۆن کاتێک حەجاج کوفری لێ دەرکەوت چەندین زانا و قورئان خوێن لەسەری دەرچوون .

**٣٥** - كوشتاریكردنی دزەكان و خەواریجەكان درووستە ئەگەر پیاو بەرگری لە خۆیی و لە ماڵی خۆی بكات ئەگەر هێرشكرایە سەر نەفسی و ماڵی هێندەی ئەوەی لە توانایەتی بەرگری لە خۆی دەكات، وە نابێت گەر ئەوان وازیان هێنا یان بەجێیان هێشت ئەو بچێت دوایان بكەوێت و دوای ئەوەی كە ئەوان وازیان لێ هێنابوو، بۆ هیچ كەس نیە ئەوە بكات تەنها ئیمام و

جێبەجێکاری مووسڵمانان دەتوانن بڕیار لەسەری بدەن، بەڵکو ئەو لەسەریەتی لەو شوێنەی کە ڕێگەی پێدراوە بەرگری لە خۆیی بکات، وە نیەتی هەبێت لە دڵەوە کە بەو بەرگری و ڕوو بەڕووبوونەوەی هیچ کەسێك نەکوژێت تەنها بەرگری بکات.

ئەگەر دزەکە لەسەر دەستی خاوەنماڵەکە کوژرا لەو کاتەی کە بەرگری لە نەفسی خۆیی دەکرد ئەوا الله تعالى کوژراوەکە - دزەکە - دوور دەخاتەوە، بەڵام ئەگەر هاتوو خاوەن ماڵەکە لەو حاڵەدا کوژرا لە کاتێك ئەو بەرگری لە خۆی و ماڵی خۆیی دەکرد تکامان وایە کە پلەی شەهادەتیی هەبێت هەروەك چۆن لە حەدیث ەکاندا هاتووە وە بە هەموو ئاثارەکان کەوا فرمانکراوە بە کوشتن بەڵام فەرمان نەکراوە بە کوشتنی و بە شووێن کەوتنی - هەموو شەڕێك کوشتن نییە چونکە ئەو خاوەن ماڵە لێرە بەرگری لە نەفسی خۆیی دەکات وە لە نیەتیشیدا نییە کە هیچ کام لە دزەکان بکوژێ بەڵکو تەنها بەرگری لە خۆیی بکات، ئەمە پێی دەوترێ قیتال، بەڵام خاوەن ماڵ یان دزەکە کوژرا ئەوە قەتلە، کەواتە لێرە فەرمانکراوە بە قیتال بەڵام فەرمان نەکراوە بە قەتل کوشتن - ، وەئەگەر بریندار کران ئەوا نابێت بچیت بەدوایانداو بیانکوژیتەوە، وە ئەگەر بە ئەسیریشتان گرتن مەیکوژن، وە حەددی لەسەر جێ بەجێ مەکە، بەڵکو هەموو ئەو کردەوانە جێبەجێکردنی حەد دەگەڕێنیتەوە بۆ پێشەوای مووسڵمانان واتە وەلی ئەمر دەبێت ئەو حوکمە جێ بەجێ بکات .

**٣٦** - شاهیدی نادەین بۆ هیچ کەسێك لەئەهلی قیبلە بە کردەوەیەك لە کردەوەکان بە بەهەشت یان دۆزەخ - ئەهلی قیبلە ئەوانەن کە موەحیدن ڕوووە و قیبلە نوێژ دەکەن - ، بەو ئومێدەین کەوا چاکەکاربێت وە دەترسین لەسەری، دەترسین لەسەر خراپەی تاوانکار، وە بەو ئومێدەین اللە تعالی ڕەحمی پێ بکات .

: واتە گەر کەسێکی موسوڵمانی چاکەکار وەفاتی کرد ناڵێیت ئەڕواتە بەهەشت، یان اللە تعالی لێی خۆش دەبێت، بەڵکو ئومێدمان هەیە اللە تعالی لێی خۆش بێت، وە ئەشترسین بەهۆی شتێکەوە کە نایزانین سزای بدات، ئەگەر موسوڵمانێکی خراپەکاریش مرد ئەوە ناڵێیت ئەڕواتە دۆزەخ، بەڵکو ترسمان هەیە اللە تعالی بیکاتە دۆزەخ بەهۆی ئەو تاوانانەی کردوویەتی، وە ئومێدمان وایە اللە ڕەحمی پێ بکات .

**٣٧** - هەرکەسێك بە تاوانێك بگاتەوە بە اللە تعالی کە دۆزەخی لەسەر واجب کردبێت، بەڵام ئەو تەوبەیی کردبێت وە پێداگر نەبووبێت لەسەر ئەو تاوانەی کە کردوویەتی ئەوا اللە تعالی لەسەر ئەو کردەوانە تەوبەیی داناوە - واتە لەسەر ئەو کردەوانەی کە دۆزەخی پێ واجب دەکات تەوبەی داناوە - ، وە تەوبە لەبەندەکانی قەبووڵدەکات، وە لە خراپەکانیشیان خۆش دەبێت.

**٣٨** - هەر کەسێك بە الله تعالى بگاتەوە وە ئەو حەدەیی لەسەر جێ بەجێ کرابوو، حەدی تاوانەکەی لەسەر جێ بەجێ کرابوو لەدوونیادا، ئەوە کەفارەتی گوناحەکانیەتی هەروەك چۆن لە رسول الله ﷺ مەوە هاتووە.

**٣٩** - وە هەرکەسێك بە الله تعالى بگاتەوە وە پێداگربووبێت لەسەر ئەوتاوانەی کە کردوویەتی تەوبەی نەکردبێت لەو تاوانەی ئەوا ئەو سزایەیی کە الله تعالى بۆیی داناوە لەسەر واجب دەبێت، ئەگەر الله تعالى وویستی لێبێت ئەوا سزایی دەدات وە ئەگەریش ویستی لێبێت ئاوا لێی خۆش دەبێت.

**٤٠** - وە هەر کەسێك بە الله تعالى بگاتەوە کافربێت سزایی دەدات و لێی خۆش نابێت.

**٤١** - وە ڕەجم کردن حەقە وە دەبێت جێ بەجێ بکرێت لەسەر ئەو کچ و کوڕانە وە ئەو ژن و پیاوانەی کە زینادەکەن، ئەگەر هاتوو خۆیان دانیان پێدانا یاخود دەرکەوت کە ئەوانە زینایان کردووە - کە دەبێت شایەت هەبێت - ، وە رسول الله ﷺ ڕەجمی کردووە، وە هەروەها پێشەوایانی هیدایەت دراو ئەوانیش ڕەجمیان کردووە.

---

: زۆر لەو کەسانەی کە کاریگەرن بە عەلمانیەت و فیکرەکەیان، وە بەشێکی حیزبە بەناو ئیسلامیەکان باوەڕیان بە ڕەجم نییە و ڕەتی ئەکەنەوە، بەم شێوەیە شتێکی ئاشکرایان لە ئیسلام ڕەتکردووەتەوە، هەر کەسێکیش کارێکی لەو جۆرە بکات ئیسلامەتیەکەی هەڵوەشاوەتەوە .

**٤٢** - هەر کەسێك کەم و کورتی بگرێت لە هاوەڵانی رسول الله ﷺ، یاخود ڕقی لێیان بێتەوە، بە ڕووداوێك کە لەوەوە ڕوویدابێت، یاخود باسی خراپەکانیان بکات، ئەوا موبتەدیعە هەتاوەکو ڕەحمەت دەنێرێت بۆ هەموویا، وە دڵی بەرامبەریان پاك دەبێتەوە .

**٤٣** - نیفاق کوفرە - لێرە مەبەستی نیفاقی گەورەیە - ، ئەوەیە کە کافر بیت بە الله تعالی و غەیری ئەو بپەرستیت، وە لە ڕووکەشدا ئیسلام دەربخەیت، هەر وەکو ئەو مونافیقانەی کە لە سەردەمی رسول الله ﷺ دا هەبوون.

**٤٤** - فەرموودەی پێغەمبەر ﷺ کە فەرموویەتی : هەر کەسێك سێ لەو خەسڵەتەی تێدابێت ئەوا مونافقە، ئەمە بۆ تەغلیظە - واتە مەبەست پێی کوفری گەورە یان نیفاقی گەورە نییە - ، ئەوە لەسەر گەورەیی کردنی ئەو تاوانەیە، دەیگێڕینەوە هەروەك چۆن هاتووە و تەفسیری بۆناکەین .

پێغەمبەر ﷺ فەرموویەتی : لە دووایی من بەکافریی مەگەڕێنەوە سەرلێشێواو مەبن وەهەندێکتان لە ملی هەندێکی ترتان مەدەن .

وە دەفەرموویت : ئەگەر دوو موسڵمان بەشەڕهاتن هەردووکیان - بکوژ و کوژراو - دەچنە دۆزەخ .

وە وەکو : جنێودان بە موسڵمان فیسقە و وە کوشتاریکردن لەگەڵی کوفرە .

وە وەکو : کاتێك هەر کەسێك بە براکەی بڵێ ئەیی کافر ئەوا ئەو کافرکردنە یەکێکیان دەگرێتەوە .

وە وەکو : خۆ بەریکردن لە ڕەچەڵەک کوفرە ئەگەر کەمێکیش بێت .

وە هاوشێوەی ئەو حەدیث انە کە بە صحیحی هاتوون و لەبەرکراوە، ئێمە تەسلیمی ئەو حەدیث انە دەبین، ئەگەرچی تەفسیرەکەشی نەزانین، وە هیچ قسەیەك دەربارەیی ناکەین، وە موناقشەی لەسەرناکەین، وە هیچ ڕوونکردنەوەیەك دەربارەی ئەو حەدیث انە نادەین ئیللا وەك ئەوەیی هاتووە، وە هیچ کام لەو حەدیث انە ڕەتناکەینەوە ئیللا بەحەقیی خۆیی نەبێت .

٤٥ - بەهەشت و دۆزەخ هەردووکیان دوو درووستکراون، هەروەکو چۆن رسول الله ﷺ دەفەرموویت : (چومە بەهەشتەوە کۆشکێکم بینی) .

یان دەفەرموویت : (حەوزی کەوث ەرم بینی) .

وه دەفەرمووێت : (بينيم لەناو بەهەشت زۆرترینی ئەهلەکەیی . . . . ، وه به دۆزەخ دا تێ پەڕیم بینیم . . . .) .

وه هەرکەسێك پێی وابێت کە بەهەشت و دۆزەخ درووست نەکراون ئەوا قورئان و حەدیث ی رسول الله ی ﷺ بەدرۆ خستۆتەوە، وا حساب ناکەم کە وا ئەو کەسە باوەڕی بە بەهەشت و دۆزەخ هەبێت .

**٤٦** - هەرکەسێك لە ئەهلی قیبلە مرد موەحید بوو ئەوا نوێژی لەسەر دەکرێت، وه داوای لێخۆشبوونی بۆ دەکرێت، وه هیچ شتێك ڕێگرنابێت کە داوای لێخۆشبوونی بۆنەکرێت، وه واز لە نوێژ کردن لەسەری ناهێنیت لەبەر کردنی تاوانێك جا بچوك بێت یاخود گەورە، وه کردەوەکانی دەگەڕێنینەوە بۆلای الله تعالی .

---

: مردووان لەسەر چەند بەشێکن :

یەکەم : کەسانێك کە ژیانیان بەڕێ کردووە بەکافریی ئەوا نابێت دووعای بۆبکەیت و نوێژیی لەسەر بکەیت .

دووەم : وه کەسانێك کە اسلامیان اعلان کردووە بەڵام لەناخیان کوفرە .

سێیەم : ئەوانە کە لەناوە و دەرەوە اسلامیان ئاشکرا کردووە .

چوارەم : کەسانێك کە خۆیی خستۆتە پاڵ اسلام بەڵام هیچ شتێکی لێ نەبینراوە لەهەمان کاتا گوناحی گەورەی هەبووە،

پێنجەم : کەسانێك کە خۆیان داوەتە پاڵ اسلام بەڵام هەڵووەشێنەرەوەیی هەیە، کەبەهەمان شێوە ئەو هەڵووەشێنەرەوانە دەبنە هۆیی تێکدانی عەقیدەکەیی لە هەمانکاتیشدا خۆی داوەتە پاڵ اسلام .

آخر الرسالة

والحمدلله وحده

وصلواته على محمد وآله وسلم تسليما